## پێشەکی

**هەمومان پێویستە خۆمان بگۆرین و بەرەو پێشەوە برۆین بەرو ئەرێنی هەنگاو بنێین.،چونکە هۆکارێکن بۆ گۆرین و بەرووەو پێشچونی تاك و کۆمەلگا، هەندێ ریگای ناوازەم بۆ ئێوەی خۆێنەر ئامادەکردووە کە بەرو بەهرەمەندی و ناوازەیی و ئەرێنی هەنگاو دەنێین.**

**تۆماس ئەدیسۆن داهێنەرو پیاوی کار ،ئەمریکیە ،هەندێ ئامێری داهێناوە کە کاریگەری زۆری لەسەر مرۆڤایەتی هەبوە ، وەك گەشە پێدانی ئامیری الفونوغراف وە ئامێری وێنەگرتن وە گلۆپی کارەبایی ، پەیامنێرێك نازناوی (ساحر مینلو بارك) لێدەنێت،ئەدیسۆن یەکێك بوە لە داهێنەرە یەکەمەکان دادەنرێت کە جێبەجێ کردنی بەهەمهێنانی گشتگیر وە کاری بە کۆمەڵ لە بەر ئەوە دادەنرێن لە یەکەم کەس کە تاقیگەی دروستکردوە بۆ لێکلینەوە پیشەسازیەکان . ئەدیسۆن لە قوتابخانە زۆر بیری لە قوتابخانە نەبوو ،مامۆستاکەی وەسفی دەکات بە( فاسد ) ئەدیسۆن دەلێ : دایکم منی دروستکرد، وە زۆر متمانەی بەمن هەبوو لەو کاتەوە هەستم کرد کە ژیان ئامانجدارە ، وە کەسێکی تر کە**

ناکری یارمەتی نەدەم   ئەویش باوکمە ، دایکی لە مالەوە وانەی پێدەگوتەوە ( Kennelly ) ١٩٣٢

ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە هەمو ئەو قوتابیانەی کە نمرە یان بروانامەی نزم بەدەست دەهێنن واتای دەبەنگی و کالفامیان نیە بەڵکو زۆرێك هەن کە بەهرەمەندن و پلەی زانستیان نزمە ، هەروەکو لە درێژەی بابەتەکە بۆت رون دەبێتەوە ، بۆیە ئێمە چۆن ئەو بەهرەمەندانە بناسینەوە و ببینە پالپشت بۆیان تاکو پلەی زانستی بەرزتر بەدەست بهێنن و ببنە داهێنەر و سەرکردەی ئەم میلەتە،وە کۆتایی بابەتەکە بابەتی چۆن زۆرترو زووتر فێربم و خۆم بەهرەممەند بکەم چەند هەنگاوێکی پراکتیکیەو سودی زۆری هەیە..... ، وەك هەمیشە بۆ ئەوەی ئاسانتر  نوسینەکانمت دەست بکەوێ بە شێوەی pdf  بلاو دەکەمەوە .

## بەهەرەدار ( المَوْهُوبْ ) كێیە ؟

زانایانی دەرونی و لێكۆلەروان لە بواری پەروەردەی بەهرەداران راجیان دەربارەی پێناسەی بەهرە و قوتابی بەهرەدار هەیە.

سیرستۆن هەندێ تواناى دیاری كردوە كە لە بەهرەدار دا هەیە :

تواناى ١- وەرگرتنی وشە ،٢-باش قسەكردن ٣- تواناى ژماردن ٤- پەیوەندیە بەتالەكان ٥-بیرگە (زاكیرە) ٦- هەستكردن ٧-بەلگە هێنانەوە .

## لەبەركردن

( بیرگە )زاكیرە لە مرۆڤدا زۆر بەبەهاو بە قەدرە هەمومان خاوەن بیرگەین بەلاّم بەكارهێنانیان جیاوازە ئەوانەی بەهرەمەندن بەزۆری خاوە بیرگەی بەهێزن بۆیە ئەگەر بمانەوێ بەهرەمەند بین پێویسە راهێنان بە بیرگەی خۆمان بكەین و بە هێزیان بكەین .

لە ژیانامەی پێشینەكان هاتوە كە :

١- هەر پرسیارێكیان لە ئیبن تەیمیە بكردایە دەربارەی ئایەتێك هەر شتێك پەیوەندی بە ئایەتەكە هەبوبێت دەهاتەوە بیری .

٢- ئیمامی عوسمان لە یەك رەكەعەتا هەمو قورئانی خوێندوە .

٣- ئیمامی ئەحمەدی كوری حەنبەلی شەییانی هەزار هەزار حەدیسی لەبەر بوە.

٤- ئیسحاقی كوری راهویەی یانزە هەزار حەدیسی لەبەر بوە هەموی دەگوتەوە بەبێ ئەوەی وشەیەك بپەرێنێت یان زیادی بكات .[1]

[1] سودم وەرگرتوە لە پەرتوكی(المهارات في فن المذاكرة) **بۆ درێژەی بابەت بگەرێیەوە سەرم ئەم پەرتوكە**

## ليّزانينى و كارامەيى دەربڕين.

بەهرەمەندان ليّزانن لە دەربرين و كەمترين هەلە ئەنجام دەدەن بۆيە ئەوانەى هەلەدەكەن دەبى ئەم كيّشەيە چارەسەر بكەن و خۆيان بەهرەمەند بكەن و يەكيّك لە سيفاتەكانى بەهرەمەندان لەخۆى بهيّنيّتە جىّ.

ئايا تۆى خويّنەر توشى شەرمەزاى بويتى لەكاتى قسەكردنت دا هەلّەت كردوە و بەشيّوەيەكى ليّزان وشەكانت دەرنەبڕيە . بۆيە ئەم ريّگانە بگرە بەر بۆ ئەوى جاريّكى تر توشى نەبى:

١- ئەو شتە ديارى بكە كە دەتەوەىّ.

٢- بيربكەوە پيّش دەربڕين .

٣- نامەكەت دەشتنيشان بكە .

٤- دەبىّ بەسەر ترس دا زالّ بيت .

٥- تەركيزت لەسەر گويّگر بيّت ،نەك لەسەر خودى خۆت .وە لەسەر ياداشتەكەت بىّ نەك لەسەر وشەكانت ، ولەسەر سەركەوتن بىّ نەك جيّگراوەكانى.

٦- بروات به خۆت و یاداشتەکەت هەبێ.

٧-ئەو شتانە بورژێنە کە گوێگر دەیەوێ وەك وەلامی ئاسان بە بەڵێ یان بە نەخێر.

٨-با دەربرینەکانت مەتاتی بێ.

٩-با هەندێ جار گالتەجاری و قسەی پێشین و چیرۆك و قسەی نەستەق و وتەکانت کوکورت بێت ، لە وتار و وانەکانتدا هەبێ.

١٠- واز لەمانە بیهێنە (ئێ - ئمم – ئاه....)

١١- وشەکانت با روون بن .

١٢- دەنگت بەرز و نزم بکە .([٢])

---

[٢] سودم وەرگرتوە لە پەرتوکی (١٠١ طريقة فورية لتنمية مهارات التخاطب ، د بيني بوف و جوكوندريل) بۆ درێژەی بابەت بگەرێیەوە سەرم ئەم پەرتوکە

## چۆن کەسانی بەهرەمەند دیاری بکەین؟

لێکۆلینەوەکانی (تێرمان) و (هۆلینگۆس) و تێرمان ئەودین دەریا نخستوە کە بەمانە دەناسرێنەوە:

١- کێشیان زیاترە لە منالانی ئاسایی لە کاتی لە دایك بوون.

٢- دەرکەوتنی ددانیان لە کاتی زوتر لە منالانی ئاسیی .

٣- قسەکردن بە زویی . کەمتر هەلەی زمانەوانی دەکەن .

٤- زوو بەسەرپێ دەکەون .

٥- درێژیان زیاترە لە منالانی ئاسایی لە کاتی منالی.

٦- زوو بالغ دەبن بەرامبەر بە منالانی تر .

٧- للیاقە و جەستەیان بە هێزترە .

٨- لەشێکی تەندروست .

٩- کەمتر نەخۆش دەکەون .

١٠- نوستنیان زیاترە لە منالانی تر.

١١- هەناسەیان ئاساییە و توشی پەرکەم نابن .[٣]

---

[٣] سودم وەرگرتوە لە پەرتوکی :(الموهبة و الابداع والتفوق أ.احمد عدنان المغربي) **بۆ درێژەی بابەت بگەرێیەوە سەرم ئەم پەرتوکە**

## بیركردنەوەی ژیرانە

الله (جل جلالە) زۆر بەهرەی پێداوین و لە هەمو دروستكراوەكانی تر جیای كردوینەتەوە یەكێك لەو بەخشانەی كە بە ئێمەی داوە بیركردنەوەیە یەكێك لە ناوداران دەڵێت: (من بیردەكەمەوە كەواتە من هەم) ئەم بیركردنەوەش بویتە جێگای تێڕامانی زۆربەی زانایانی كۆن و نوێ،لەوانە فەیلەسوفان و دانایان و ......

گومان لەوە دانیە كە كە هەریەكەمان شێوازی بیركردنەوەمان جیاوازە ، ئەوەش كاریگەری لەسەر ڕەوشت و هەلسو كەوت و توانای فێربون و پالنەرەكان دەبێت ،بۆیە هەمومان حەزەكا نمان و بەرهەمەكا نمان جیاوەزە ،بیركردنەوەكان جیاوازن لەوانە بیركردنەوەی : داهێنەرانە و ڕەخنەگرانە و تێڕامانانە و بیركاریانە و زانستیانە ....

بیركدنەوە لەگەل فێربون و زمان و بیرگە(الذاكرة) پەیوەندیەكی قولیان هەیە وە هەندێ جار ئاسان نیە لێكیان جیابكەینەوە ،چونكە هەمویان كاریگەریان هەیە لەسەر ئەو هەلس و كەوتانەی كە رۆژانە ئە نجامیان دەدەین .

هەندێ بیرکردنەوە روکەشیانەیە وەهەندێکی تر قولە

**بیرکردنەوەی روکەشی :**

١- گرنگی بە شێوەی جولێنەر و تایبە تمەندیە مادیەکەی دەدادت وەك قەبارە و رەنگ و ئاواز .

٢- دوبارەکردنەوەی جولێنەرەکان ئەوەش رێگایە بۆ لەبەرکردنی و کۆگاکردنی.

٣- بێهێزی لە دوبارە گەرانەوەی زانیارەیەکان وە شکست هێنانی لە ناسینەوەی رووەکان و وشەکان یان ماناکان .

٤- پێویستی بە توانای تایبەت نیە بەڵکو مەرجی گشتین بۆ هەست کردن و بیرکردنەوە .

بیرکردنەوەی قول:

١- بیرکردنەوەی قول : گرنگی بە مانای جولێنەرەکان دەدات .

٢- شیکردنەوەی جولێنەرەکان ئەوەش رێگایە بۆ لەبەرکردنی و کۆگاکردنی.

٣- ئاستێكی بەرزی لە لەبەركردن و گەڕاندنەوەی زانیارەیەكان و وە بیرهێنانەوەی ماناكان هەیە .

٤- پێویستی بە توانای تایبەت هەیە بۆ بیركردنەوەی قوڵ وەك جیاكردنەوە وە هەستكردنی بە وردو درشتەكان .[٤]

## فێربونی خێرا چیە ؟

بەهرەمەندان زوو فێردەبن ئەمەش یەكێكە لە خاڵە بەهێزەكانی بەهرەمەندان بۆیە هەندێ ڕێگای زوو زۆر فێربونمان بۆ ئێوەی بەڕێز ئامادە كردووە ،

ڕێگایەكی پربەهاو بە سودە بۆ ئەوانەی دەیانەوی زوو زۆر فێربنن

پێویستە لەسەر مێشك شتێك بزانی مێشك دەبێتە دوو بەش لای ڕاست و لای چەپ ، لای ڕاست بەپرسە لە بیركردنەوەی داهێنەرانە وەك مۆسیقا و وێنەو ....

لای چەپ زیاتر بەپرسە لە بیركردنەوەی مەنتقی وەك زمان و وشەو قسەكردن و .....

[٤] - سودم وەرگرتوە لە پەرتوكی ( تنمية مهارات التفكير ) بۆ درێژەی بابەت بگەڕێیەوە سەرم ئەم پەرتوكە

بۆئەوەی خێراتر و زۆرتر فێربین دەبێ هەردوو لای مێشکمان بەکاربهێنین،

ئێمە کۆمەڵێك رێگا بەکاردەهێنین بۆ ئەوەی زوتر و زیاتر فێربین چونکە ئەو شتانەمان بەبیردێتەوە لەوانەی:

١- ٪٢٠ دەخوێنین،

٢- ٪٣٠ دەبیبیستین.

٣- ٪٤٠ دەیبینین.

٤- ٪٥٠ دەیلێیین.

٥- ٪٦٠ کە دەیکەین.

٦- ٪٩٠ کە دیلێین و دەیکەین.

**شەش رێگا بۆ ئەوەی زوتر و زۆرتر فێربین:**

١- لایەنی دەرونی ئامادەبە.

٢- زانیاریەکن کۆدەکەمەوە .

٣- خالە سەرەکیەکان لەبەردەکەم .

٤- خۆت تاقیبکەوە کەزانیارت تا چەندە.

٥-	ئەو شتنانەی فێریان دەبی بەرجەستەیان بکە لە خۆت .

شیکردنەوەی هەنگاوەکان

هەنگاوی یەکەم:

لایەنی دەرونی ئامادەبە.

لە شوێنێکی هێمن دانیشە تەمەشای خۆت بکە کە تەواو بویت و فێربویت.

بیرت لە کۆتا ڕێز بێت .

ئاسودەبە

بەئارامی ئامانجەکە دەست نیشان بکە وە کاتی بۆ دابین بکە .

هەنگاوی دوەم

زانیاریەکان کۆ دەکەمەوە .

لە خۆت بپرسە دەربارەی سەرە بابەت.

پێنوسی ڕەنگاو ڕەنگ بەکاردێنم بۆ نوسینی تێبینیەکانم .

بابەتەکە بەش بەشی بچوك بکە .

ئەو بابەتانە دیاری بکە کە شایستەتن .

ئەو زانیاریانەی لات زانراون دیاری بکە .

هەنگاوی سێیەمم :

بابەتەکە دەدۆزمەوە

هێڵکاری و نەخشەی زهنی دروست دەکەم( mind map).

پارچە کاغەزی بچوکی رەنگاو رەنگ بەکاردێنم .

تۆمارکردنی دەنگی ئە نجام دەدەم.

کەسانی تر فێردەکەم .

دوبارە هەمو پرسیارەکان دەکەمەوە .

هەنگاوی چوارەم .

خالە سەرەکیەکان لەبەردەکەم .

تۆمارکردنی خالە سەرەکیەکان وە رێکخستنیان .

بەکارهێنانی پارچە وەرەقە.

خۆت تاقیبکەوە ئەوەی دەتوانی بەبیرەخۆتی بهێنەوە . لە بیرگە یان بە

وێنە یان بە یاریەکان .

بەکارهێنانی تێنوسی گیرفانی .

هەنگاوی پێنجەم .

خۆت تاقیبکەوە بزان چەندی دەزانی.

بۆ کەسێکی تر شی دەکەمەوەو باس دەکەم .

گوێ دەگرم لە تێبینی و پێشتیاری کەسانی تر.

پێوانەیك دانی بۆ کوالێتی زانیاریەکانت .

بابەتەکە دوبارەو چەند بارەبکەوە .

**هەنگاوی شەشەم**

ئەو شتانەی فێردەبی لەخۆتی بەرجەستە بکە کولێتیان دیاری بکە ،

ئەوشتانە چین کە باش فێربویت ؟

ئەو شتە چیە کە دەتوانی بەباشیتر فێریان بی؟

ئەو شتاچین کە فێریان دەبم لە جاری دواتر .[٥]

---

[٥] سودم وەگرتوە لە پەرتوکی (التعلم السريع). **بۆ درێژەی بابەت بگەرێیەوە سەرم ئەم پەرتوکە**

دەربارەی قوتابی بەهرەدار ماریلاند(Mareland,) دەلێت: ئەو قوتابییەیە کە دەست نیشان دەکرێت لە لایەن کەسانی پسپۆر لەبەر ئەوەی خاوەن توانا وئاستی بەرزە بە بەراورد لەگەل هاوشانانی لە هەمان تەمەن لە لایەنە دیاریکراوەکان پێویستی بە پرۆگرام و خزمەتگوزاری پەروەردە و فێرکردنی تایبەتتی هەیە کە سەروی ئاستی ئەو پرۆگەرامانەیەی کە لە قوتابخانەکان هەیە ،کە توانای لە مانە یان یەکێك لەو تواناناینەی هەیە :

١- تونای ژیری گشتی : پێوانە دەکرێت بە هۆی ئەو نمرەیەی بەدەستی هێناوە لە یەکێك لە ئەزمونانەی زیرەکی جیاواز وەك یەکە ج بەشێوەی تاکی (فردی)وەك ئەزمونی استانفورد بینیە یان وکسلر یان بە شێوەی کۆمەلە وەك ألفا یان بیتا .

کەسەکە وەسف دەکریٚ بە ئەگەر ئەو تواناناینەی تێدا بوو : توانای فێربون یان توانای هەستکردن بە پەیوەندیەکان یان توانین و بیرکردنەوە.یان توانای خۆ گونجاندن یان بیرگەی روناك یان

توانین لەسەر دۆزینەوەی سیفاتی هاوشان بۆ شتەکان و مرۆڤەکان

.....

٢-ئامادەکاری ئەکادیمی تایبەت : ئەوەش پێوانە دەکرێت لەو مەیدانەی کە تێیدایە وەك بەدەست هێنانی نمرەی بەرز ، یان لە لایەنی ئەکادیمی وەك بیرکاری یان زمانەکان .....([6])

بەهرە دوو جۆرە بەشێکیان لە خوددا هەیە و بەبێ دەسلاتی کەسەکە ، وە بەشێکی تریان بە شێوەی راهێنان و هەوڵدان بەدەست دێت ، بۆیە بەهۆی راهێنانەوە زرۆبەمان دەتوانین بەهرەمەند بین ، وە سیفاتەکانمان وەك بەهرەمەندەکان بێت ،

لەو کاتەی کە لویس تیرمان کە وای بۆ دەچوکە زیرەکی تاکە پێوانەیە بۆ ئەوەی قوتابیە بەهرەمەندەکان بناسینەوە ،زۆرێك لە لێکۆلەران پێیان وابوو کە منالە بەهرەمەندەکان ئەوانەن کە خاوەن توانای ژیری بەرزن وە نمرەی زۆر بەرز بەدەست دەهێنن ، بەلأم لە سەدەکانی ئەم دواییانە و لە سەدەی بیستەم باوەرێك دەرکەوت لەلای هەندێك لە

[6] پشتم بە پەرتوکی (الموهوبون ذوو التحصيل العلمي المتدني) بەستوە ، **بۆ درێژەی بابەت بگەرێیەوە سەرم ئەم پەرتوکە**

لێکۆلەران و پەروەردەکاران کە هەندێ منالی بەهرەدار دەکرێ ئاستی نزم بەدەست بهێنن لە خوێندن .کە هەندێکیان دەنالێنن و قورسە بەلایانەوە فێربن.ئەوانە ناونران بەهرەمەندانی خاوەن دوو تایبە تمەندی (twice Wxceptional) ئەوانە پێویستیان بە چارەسەری لایەنە لاوازەکان وە هاندانیان لە لایەنە نایابەکان هەیە لە هەمان کاتدا (Mills &Brody 1997).

ئەوەش جەختی لەسەرکراوە وە لە لایەن لیون (Lyon ,1978) ئاماژەی پێکراوە کە تۆماری قوتا بخانەکان لە قۆناغەکانی سەرەتایی لە زۆرێك لە بەهرەمەندان و ژیرە بالاًکانن و بەناوبانگن ، دەرکەوتوە کە ئاستیان رەنگدانەوەی توانای تەواویان نیە، وەك ئەوەی کە لە قۆناغی ئاقلی دەرکەوتوە ،شاعیری ئینگلیزی ناسراو شیلی(shelly) لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دەرکرا لە دوای سالێك دەست بەکاربونی لە زانکۆ، هەرچی داهێنەری ئەمریکی تۆماس ئەدیسۆنە (Edison) ئاستی نمرەکانی بەدەستی هێنابوو لە ژێر ناوەند بوو،وەکو نوسەری ئەمریکی فیتزاجیرالد (Fitzgerald) خوێندکارێکی لاواز بوو وە تێکڕای نمرەکانی لە ژێر

ناوەند بوو ، وە هەروەها ئەلبێرد ئەنیشتاین ( Enistein ) خاوەنی گریمانەی رێژەیی، پێوەی دیاربووە کە زوو بێزار دەبوو بە رێساکانی زمان لە قوتابخانە ، وە هەروەها ئەورد تورانس ( Torrance 1965 ) وە هەندێ ناویتر وەك : فرانكلين روزفلت، وجون كيندى وەك کەسانی بەهرەمەند کە لەوانەن کە پالنەریان نەبوە ، بۆ ئەوەی فێری خوێندنی قوتابخانە بن ، هەمویان خاوەن ئاستی ناوەند و لە خوار ناوەند بوون .

بابەتەتی بەهرەمەندان و بە دەست هێنانی نمرەی نزم یەکەم جار لە زانكۆی هوبكنز لە ویلایەتە یەکگرتوەکان رونكرايەوە سالی ١٩٨١ لەسەر دەستی هەندێك لە زانایانی پەروەردەی تایبەت ،ئەمەش بە کێشەیەکی باو دادەنرێت لە لای بەهرەمەندان ،دەستەی نیشتمانی بۆ جیاکاری لە پەروەرە ( NCEF 1984 ) ئاماژەی بە داوە کە 10% تا 20% قوتابیان ئەوانەی کە لە قوتابخانە رادەکەن بەهرەمەندەکانن، وە 50% قوتابیە بە هەرەمەندەکان ئاستیان رەنگدانەوەی تواناکانیان نیە لە قوتابخانەو خوێندنی ئەکادیمی ،ئەوەش هەروەکو ئەو لێکۆلینەوەیەیە کە سیلی ( Seeley ) لەسەر قوتابیە بەهرەدارە لارەکان

(هارو هاجەکان)کردی. کە وای دەبینی کە 18%تا 40% قوتابیە بەهرەدارەکان لە قۆناغی دواناوەندی هەستیان بە شکست کردوە لە قوتابخانەکان . ئەوەش هۆکار بوە بۆ ئەوەی راکەن لە قوتابخانەکان یان هەستیان بە نزمی نمرەی بەدەست هێندراویان کردوە ،هەروەها ریم (Rimm) وای دەبینی کە 10%تا 20%ئەوانەی قوتابخانە یان خوێندن جیدێلن ئەوانەن کە پلەی زیرەکیان بەرزە .

فورد (Ford) لێکۆلینەوەیەکی لەسەر قوتابیە بەهرەمەندە رەشەکان کرد کە 38%بەدەست بیٚ پالنەوە دەنالێنن . کەچی (Newman, 1992; Whitmore, 1986) وای دەبینی کە رێژەی قوتابیە بەهرەمەندەکان ئەوانەی بە دەست کەمی ئاستیان لە قوتابخانەکان دەنالێنن 20-50% ئەوەش بە هۆی کەمی پالپشتە لەلایان کە کەم پالپشت دەکرێن لە لایەن بە خێو کەرەکانیان .

بەزۆری ، منالە بەهرەمەندەکان دەناسرێنەوە بەوەی توانایان لەسەر فێربون و زوتر فێردەبن لە هاورێکانیان ، بەزۆری ئەم بەهرەمەندانە لەگەل هاوپۆلەکانیان لە پۆلە جیاوازەکان وە لەگەل قوتابیە

ئاساييەكانن وە يەك ناگرنەوە لەگەل پرۆگەرامی خوێندن چونكە ئاستی ئەوان لە سەروی پرۆگەرامەكەن بۆیە هەست بە بێزاری دەكەن قوتابخانەكان .

( الزيات ) وای دەبینی لاوازی متمانەی بە خێوكەر وە كۆنترول نەكردنی خۆد دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی نمرەی نزم لە لای هەندێ قوتابی ئاست بەرز و ژیر.وە لێكۆلینەوەكان دەلێن كە قوتابییە بەهرەمەندەكان كە نمرەی كەم بەدەست دەهێنن ئەمە دەدەنە پال پالنەرە دەرەكیەكان ، دركیان كەم دەبێ بەوەی كە رۆلی هەولْ و كۆشش و كاریگەری لەسەر سەركەوتنەكان ،بۆیە بەزۆری نمرە بەدەست هاتوەكانیان كەم دەبێ ئەمەش بە گوێدانە جیاوازی تاك و وە پێچەوانەی ئەوانەی كە خاوەن نمرەی و ئاستی بەرزن وە بەزۆری ئەوانە متمانەیان زۆر بە هێزە . ئەوانە ناسراون دەركەوتوە كە بەهرەمەندن و نمرەیان كەمە دەبێ چەندین كەسی تر كە بەهرەنەند بن و نەناسراون ئەوانەش زۆرتر دەبن ئەگەر بەرنامەیەك نەبێ بۆ ئەوەی ئاستیان بەرزتر بێت و توشی ئەم كێشەیە نەبن و بە ئاسانی بەسەریان تێبپەرێت .

مەفهومی (ئەو بەهرەدارانەی کە خاوەن نمرەی نزمن ) سرنجی زانایانی بۆ لای خۆی راکێشا ، وە پسپۆرەکانی پەروەردەی تایبەت وە لێکۆلەرەوەکان لە مەیدانی پەروەردەی بەهرەداران و باوکان .....[٧]

---

[٧] پشتم بە پەرتوکی (الموهوبون ذوو التحصيل العلمي المتدني) بەستوە ، **بۆ درێژەی بابەت بگەرێیەوە سەرم ئەم پەرتوکە**